# ڕەنگە کاڵبووەوەکانی دنیا

## گەروس عەبدولمەلکیان

شیعر

وەرگێڕانی لەفارسییەوە

مەریوان هەڵەبجەیی

٢٠٠٨ سلێمانی




سەرپەرشتیاری پرۆژە: جەبار سابیر

جێگری سەرپەرشتیار: ئارام سدیق

**ڕەنگە کاڵبووەوەکانی دنیا**

- وەرگێڕانی: مەریوان هەڵەبجەیی
- بابەت: شیعر
- تایپ: یانەی قەڵەم
- نەخشەسازیو بەرگ(ناوەندی دیزاینی یانەی قەڵەم)
- چاپ: یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- سەرپەرشتیاری چاپ: ئاسۆ پێنجوێنی
- چاپخانە: (یاد) بازاڕی سۆز
- ژمارەی سپاردنی(٩٩٠) وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ناونیشان: یانەی قەڵەم، سلێمانی، سابونکەران، بینای هەورامان
نهۆمی سێهەم. ژمارەی تەلیفۆن: ٠٧٧٠١٥٧٥٧٢٦

**لەچاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم**

**زنجیرە(٢٥)**

# بیۆگرافیای شاعیر

گەروس عەبدولمەلکیان دوانزەی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٨٠) لەتاران لەدایکبووە. لەمنداڵییەوە دەستی بەنووسین کردووەو لەتەمەنی چواردە پازدە ساڵییەوە بەرهەمەکانی لەگۆڤارە مناڵان و مێرد مناڵانەکاندا بلاوکردۆتەوە. چالاکی و کاری پرۆفیشناڵی خۆی لەچاپی شعرو رەخنەو وتاری ئەدەبی لەگۆڤارە بەناوبانگەکانی وەك، "کارنامە"، "گەوهەران" ، "شیعر"، "الفبا"، "رووکی" هتد.. .. بلاوکردوەتەوە. لەساڵی (٢٠٠٢) دا یەکەمین کۆمەڵە شیعری بەناونیشانی "نیوەی شاراوە" بلاوکردوەتەوەو ئەم کتێبە خەلاّتی "کتێبی ساڵی شیعری ئەمڕۆی ئێران – کارنامە"ی بەدەستهێناوە ساڵی (٢٠٠٣) بەکالوریۆسی لەبەشی "ئەندازیاری پیشەسازی" لەزانکۆی "ئازاد – ئەهلی" تەواو کردووە. ساڵی (٢٠٠٣) دووەمین کۆمەڵە شیعری بەناونیشانی "رەنگە کاڵبووەوەکانی دنیا" بلاوکردۆتەوەو، ئەم کتێبەش یەکێك بووە لەکتێبە هەڵبژێردراوەکانی ساڵی شیعری لاوانی ئێران و هەروەها یەکێك بوو



لەچوار کاندیداکەی کتێبی ساڵانەی وەزارەتی رۆشنبیری. کۆمەڵە شیعری "رەنگە کاڵبووەوەکانی دنیا" لەماوەی کەمتر لەساڵێکدا سێ جار چاپکراوەو پێشوازییەکی زۆری لێکراوە. باڵندەی شاراوە لەساڵی (٢٠٠٦)داو بۆ جاری دووەم چاپکراوەتەوە. گەروس عەبدولمەلکیان تائێستا چەندین خەلاّتی بەناوبانگی ئێرانی و جیهانی بەدەستهێناوەو دەکرێ ئاماژە بکەین بە:

١-خەلاّتی سەرتاسەری شیعری لاوانی ئێران – بەندەر عەباس ٢٠٠١

٢-خەلاّتی کتێبی ساڵی شیعری ئەمڕۆی ئێران – کارنامە ٢٠٠٢

٣-خەلاّتی سەرتاسەری شیعری لاوانی ئێران "شەوانی شەهریوەر" ٢٠٠٢

فلاشباك

دەرفەتێك نەماوە
وەرە بایەكتر لەئامێزگرین
سبەی
یامن تۆ دەكوژم
یاتۆ چەقۆكە لەئاودا دەشۆی
هەر ئەم چەند دێڕە
دنیا هەر ئەم چەند دێڕەی ماوە
لەگەڵ ئەوەی كەمرۆڤ
بەمناڵی بمێنێتەوە باشترە
لەدایك نەبێت باشترە



بێ ناو

دات لەشانم
تاتەنیاییت تەكاندبێت
دڵت بەچی خۆشكردووە؟!
تەكاندنی بەفر
لەشانەكانی شێرە بەفرینە

دوو دڵی‌و وەستان

تەنانەت گومانم
لەناوی تۆش هەیە
لەدرەختەکان و
لەلقەکانیشیان کەڕەنگە رەگ‌و ریشەکانبن
رەنگە چەندین ساڵ بێت کەلەژێر زەویدا دەژین
کێ جێگای دنیای گۆڕیوە؟
بۆچی باڵندەکان
لەگەدەی ئێمەدا دەفڕەن؟
بۆچی حەبەکان لەدایکبوونم دوا دەخەن؟
چەندین ساڵە
لەژێر زەویدا دەژین و
رەنگە



رۆژێك بەتەمەنی حەفتا ساڵانەوە لەدایکبم
هەستیش بکەم مەرگ
کراسێکە لەبەری دەکەم
دەتوانین قۆپچەکانی داخەیت
یابیکەینەوە
دەتوانیت قۆڵەکانی هەڵبدەیتەوە
دەتوانیت...
مەزەندەکەی من پیاوێکی بەندکراوم
لەوەرزەکانی ئەودیو دیوارەوە

## سکێچ

دەریای دووری گەورە

یاچاڵی بچووکی ئاو

جیاوازی نییە

ئەگەر زوڵاڵ بێت

ئاسمان لەدەستی تۆ دایە



## پازل

گەڕاونەتەوە

ئازارە کۆنەکان

وێنە تاریکەکانی

من لەئاوێنەدا

من

لەخەونەکاندا.

ئەمجارەیان دەمەوێت

خۆم

پارچە

پارچە

پارچە بکەم

تابەڵکو دووبارە
دەستی کەسێك
نا!
ئەم پازلە
هەزار جاریش هەڵچنیتەوە
هەر وەك خۆی لێدێتەوە.



خشتەکان

درۆ دیوارێکە
کەهەموو بەیانییەك خشتەکانی هەڵدەچنی
پەنای بیٚ ئاگای من!
دەرگاکەت لەبیرکردووە
ئاو تاملم هاتۆتە سەرەوە
خشتەکان تا ملم هاتۆتە سەرەوە
ئاو تا لێوم هاتۆتە سەرەوە....
ئاو هاتۆتە سەرەوە
بەڵام من نامرم
من دەبمە ماسی

نوختەی رەش

لەئەم دێڕەدا
یالەدێڕەکانی دواتردا
نوختەیەك دێت
کۆتایی هەموو پەیڤەکانە.
لەچوارچێوەی غەمگینی پەنجەرەدا
قژی ماندوو
کراسی رەشی کچۆڵەیەك کەدووردەکەوێتەوەو
دووردەکەوێتەوەو
دووردەکەوێتەوە
لەچوار چێوەی غەمگینی پەنجەرەدا
نوختەیەکی رەش
دووردەکەوێتەوە
نوختەیەك

کەکۆتای هەموو پەیڤەکانە.



ژوور

لەدەوروبەری ماڵەکەمدا
ئەو کەسەی بیر لەدیوار دەکاتەوە
ئازادە
ئەو کەسەی کەبیر لەپەنجەرە دەکاتەوە
غەمگینە
ئەوەش کەبەدوای ئازادیدا دەگەڕێت
لەنێوان ژوورێکدا دانیشتووە.
دەوەستێت
چەند هەنگاوێك دەڕوات
دانیشتووە
دەوەستێت

چەند هەنگاوێك دەڕوات
دانیشتووە
دەوەستێت
چەند هەنگاوێك دەڕوات
دانیشتووە
دەوەستێت
چەند هەنگاوێك دەڕوات
دانیشتووە
دەوەستێت
چەند هەنگاوێك دەڕوات
دانیشتووە
دەوەستێت



چەند هەنگاو....
تەنانەت تۆش ماندووبویت لەم شیعرە!
ئیدی
چ بگاتە ئەو
کە
دانیشتووە
دەوەستێت
نا!
کەوت

## کام پرد

کچانی شار
بیر لەگوند دەکەنەوە
کچانی گوند
لەئارەزووی شاردا دەمرن
پیاوە بچووکەکان
بیر لەئاسوودەیی پیاوە گەورەکان دەکەنەوە
پیاوە گەورەکان لەئارەزووی ئارامی پیاوە بچووکەکاندا
دەمرن
کام پرد
لەکوێی جیهاندا
رۆخاوە
کەهیچ کەس ناگاتە ماڵەکەی



## کەلاوەکان

بۆ شاری بەم

پەنجەرە رەشە
مێز، رەش
ئاسمان، رەش
بەفر، رەش
خراپ تێمەگە....
نەدەرمانم دەوێت
نەدەروونناس
تەنیا ئەم بەردانە لابە!
خۆڵەکە
کەم
کەم لابدەو

سەیری چاوەکانم بکە!
چاوەکانم کەوەك زەوی خڕە
وێناگەلێکی دنیا
ئەو دنیایەی کەدەرگاکانی قوفڵە
دنیای دیوارە بیٚ کۆتاکان
هێندەی کەهەر جارە لەبەرامبەر ئاوێنەدا دەوەستم
وێنەی کیسەڵێکی بەپشتا کەوتوو
دەمخاتە چاوەڕوانی ڕێبوارێك
تابێت‌و دنیا هەڵگێڕێتەوە
شەوێك
لەتاو ئەم هەموو تەنیاییە



دەستەکانمان دەلەرزێت‌و
هێڵی بەسەردادێت
نیگاری هەموو ساڵەکانمان بەسەر ستاندەکەوە
کەلاوەکانی (بەم) بەسەر ستاندەکەوە
ئەو دیوارانەی کەدروستمان کردووە
ئەو دیوارانەی کەبەسەرماندا ڕوخا
بەڵام
من لەوێنەکانی دواتری ئەم شیعرە دەترسم
دەترسم خودا هەموو دەرگاکان لابات
بیخاتە سەرکۆڵی‌و دوورکەوێتەوە
دوور
دوور
دوور
هێندە کەمن بنووسم:
ڕۆژێك کلیلە ونبووەکان دەدۆزینەوە
چی لەقوفڵە ونبووەکان بکەین؟

وەرگێڕانێکی خۆم

باڵندەکانی سەربانم خۆشدەوێت
ئەو دانانەش کەهەموو رۆژێك دەیاندەمێ
لەناویاندا باڵندەیەکی بێ وەفا هەیە
کەدەزانم رۆژێك دەچێتە ئاسمان و
ناگەڕێتەوە.
من ئەوم زیاتر خۆشەوێ.



تۆڵە

دەمەوێت بتکوژم
بەڵام
چەقۆ دەکەم بەسنگی خۆمدا
نازانم
تۆ دەکوژرێیت
یامن؟

دۆزەخو گیرفانە دڕاوەکان
ئەملا یا ئەولا
جیاوازی نییە!
مرۆڤ
بەسێبەری درەخت رادێت
بەئاگرنا
بەڵام
هیندەش خراپ نییە کەتۆ پێتوایە
خراپ نییە هەندێکجاریش گیرفانەکانت دڕاوبێت
پلیکانەکانی ئەو تەلارانە لەبیربکەیت کەگەیشتوونەتە
ئاسمان



لەقەراخ شەقامدا دانیشتوو
بەپلیکانەکانی خۆتا بچیتە خوارەوە
پلە
پلە
پلە
تاکەسانێك دەبینی
دانیشتوون
هەندێك دەگرین
هەندێك گۆرانی دەچڕن...
لەپڕ کەسێك دەبینی
کەدەیناسیت
بەڵام....

رەنگە نەشی ناسیت

بەڵام....

ئەو زەردەخەنەیەی کەهاتۆتە سەر لێوت

تەنیا تادوو دێڕی تر لامەبە:

لەبەهەشتدا هەندێکجار

لەدۆزەخدا هەمیشە

دەگەیتە خوا.



## نادیاری قوفڵەکان

نەهەتاو بەڕەشی رادێت

نەمن

بەتاریکی فاڵی ئەم فنجانە

نەهەتاو بەڕەشی رادێت

نەمن

بەڕەنگە لەکاڵبووەوەکانی ئەم ژوورە.

دەرگاو قوفڵە داخراوەکان زیندوم دەکەنەوە

ئەوەی کەسبەی دێیت

نەك ئەوەی کەدوێنێ هاتووی

ئەمەی کەنیت

نەئەو ماچە وەنەوشەییانە
دەرگاو قوفڵە داخراوەکانی زیندووم دەکەنەوە
دارستانێکی لەتەمدا
نەدرەختەکانی نیوەڕۆی هاوین
نادیاری مەرگ
نەك لەدایکبوونێکی نادیار
دەرگاو قوفڵە داخراوەکانی تۆ....
ئەو شیعرانە نا کەخوێندوتنەتەوە
ئەو دێڕانە کەماوە تۆ زیندو دەکاتەوە
گوێبگرە:



کۆچ
تۆڕەکەم لەهەموو دەریاکاندا کۆدەکەمەوە
ماسییەکان جوانترن لەشیعرەکانی من
ڕێگای ماڵەوەتم لەیادەوەری پێڵاوەکانمدا سڕیوەتەوە
غەمگین مەبە!
خۆشت دەزانی
هەمیشە وێنەی تەنیاییت جوانتربووە
جوانی تۆو ماندویەتی ئەم دیوارە
کەبەرهەرحاڵ پاڵیداوە بەمنەوە
دڵم تەنگە
ڕێك وەك ئەو حاجی لەق لەقەی
کەباڵەکانی بۆ کۆچ تاقی دەکاتەوە
دڵم تەنگەو

دەزانم
ئەم فڕۆکەیە هیچ کاتێك
نانیشێتەوە بەسەر دەریاچەیەکەوە
دڵم تەنگەو
سەری ئەم قوتووە
ناکرێتەوە
دواجار
حەبەکانم دەخۆم



## یاری

یارییەکە دەگۆڕێت و
خۆت بەگوریسێکدا هەڵدەواسی
کەچەندین ساڵ لەمەوپێش جۆلانێت پێکردووە
ئێمە
دووبارەی پارچەکانی یەکترین
وەکو تۆ کەجۆلانێ دەکەیت کوڕم
وەك من
کەجۆلانێ بەتۆ دەکەم
تاگوریس لەبیربکەم

ئەو دێڕانەی کەماونەتەوە
من لە تۆ پەنجەرەو
تۆیش لە من پلیکانەت دروستکرد
کە بەرامبەریشت دەوەستم
زەردەخەنەت نا
خەمێکی نامۆ
دێتە سەر لێوەکانت
خوا کە قسەی خۆیکرد



ئەم چەند دێڕە کەماوە
دەنووسم و
نوختە
سبەی
تەنیا وێنەیەکی تۆ دەمێنێتەوە
لە چوارچێوەیەك لە ئاسماندا
لە هەتاودا
منیش کە بەتەواوی راکشاوم
نەبەفر
نەباران

خۆڵ

لە ئاسمانەوە دەبارێت و

دەبارێت

دەبارێت

بەسەرمدا

من گەرم ببووم

تازەش دەزانم

کە چاوەکانت کەم کەم

کەم دەبێتەوە

من تەنیا دەبم

تۆ تەنیا....

نا!

ئەم فەرمانە

بەلابردنی هاوشێوەکەی دەزانم نابێت.



سکێچ (٢)

لە ژێر ئەم ئاسمانە هەورینەدا

بیر لە مانای ناوەکەی دەکاتەوە

گوڵی گوڵە بەڕۆژە.

## مێرووله

من مردووم
تەنیا من و تۆش
ئەمە دەزانین
تۆ
کە تەنیا چای دەکەیتە کوپەکەی خۆتەوە
لەوە ماندووترم کە دانیشم
دەچمە شەقام
تەوقە لەگەڵ هاوڕێکانم دەکەم
وەك بڵێی هیچ ڕوینەداوە
وایدانێین کلیلەکەت لە قوفڵی دەرگاکەدا سوڕاند



دڵت ناکرێتەوە
دەزانم
من مردووم
بەس من و تۆش ئەمە دەزانین
کە ئیتر ڕۆژنامە بە دەنگی بەرز ناخوێنیتەوە
ناخوێنیتەوەو
ئەم بێدەنیگییە منی شێتکردووە
تا ئەو ڕادەیەی کە هەندێکجار حەز دەکەم
ببمە مێروولەیەك
تا لەگەڕوی شمشاڵێکدا ماڵ دروستبکەم و
(با)ش نۆتەکان بێنێتە ماڵەکەم

یا من لەڕەشایی قیری سەرشەقام بکاتەوەو
بمخاتە سەرکراسە سپییەکەی تۆ
کە دەشزانم
دیسان فڕێمدەدەیت
هەر لەپەنای ئەم دێڕانەدا
هەر لە پەنای ئەم ڕۆژانەدا
لەم ڕۆژانەدا
لە خەونەکانمدا وێنایەك هەیە
دەمترسێنێت
وێنای گوریسێکی هەڵواسراو بە سەقفدا
پیاوێك هەڵواسراوە بە گوریسەکەدا
پشتی لە منەوەیە
تەنیا ئەمە دەزانم منیش
دەترسم هەڵی گەڕێنمەوە



## فاڵ

ڕێك وەك فنجانی قاوە
کە بەتاڵ دەبێت
پەنجەرەکە
کەم کەم
بەتاڵ دەبێت
لە وێنای تۆ
ئێستا
من ماومەتەوەو
پەنجەرەیەکی بەتاڵ و
فنجانێك قاوە
کە پەشیمانە لەو قسانەی کە نەکراوە

## سترانی تەم

بلیتی شەمەندۆفێر دەدڕم
لەگەڵ دوایین مێگەلی کەڵە کێوییەکانیشدا
دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە
هێندە شاعیرم
کە لقەکانم چرۆیانکردووە
سترانیشم
وەك تەمێك بەسەر دەریاچەدا دەڕوات
تەقینی هەر گوللەیەك تورەییەکە
کە لە تفەنگ کەم دەبێتەوە
سنگم ئامادە کردووە
تا تۆ میهرەبانتربیت



## کەوتن

نەخاك
نەبازنەیەك
لە دەفتەری نیگارکێشانی کچۆڵەیەکدا
زەوی
سەرێکە کە جیابووەتەوە لە جەستەی
دەسوڕێتەوە بە ئاسماندا
ئێمە وەك (بیر)ە هەڵواسراوەکان دەڕژێین
وەك دێڕە نادیارەکانی
سەر دەستی شاعیرێك
بێدەنگییەکی درێژخایەنیش
لەگەرووی بەردینی گۆڕستاندا

دەڕژێین
زەرد بەسەر پاییزداو
سەوز کە هەرچی دەگەڕێت
جێگایەك نادۆزێتەوە بۆ دانیشتن دەڕژێین
وەك چای لە فنجانەکەی (ناسرەدین شا)دا
دڵۆپە خوێنەکان لەحەمامی (فین) دا
دەوەرین
ورد
ورد
ورد
وەك بەفر
کە هیچکاتێك هیچ کەس نەیزانی
پارچەکانی هەورێکە کە خۆی کوشتووە



دەوەرین
وەك بۆمبا بەسەرخاکدا
وەك خاك دەڕژێین بەسەر تۆدا
ئەم سێوەش بۆ تۆ کچۆڵە
دووبارە بیربکەرەوە
نیوتن
هەرگیز ئەو شتەی
کە دەبوو بیدۆزێتەوە
نەیدۆزییەوە.

## بێدەنگی

هاواری من
بڵند ترنییە لەبێدەنگی تۆ
ئێمە
بەشەقامە گەورەکاندا تێدەپەڕین
تا بەڕێگا بچکۆلەکان بگەین
لەڕێگا بچوکەکانیشەوە...
تاشۆستەیەکی خاکی
لەکۆتایی خۆیدا
من بگەیەنێـتە کوخێك
تالەچوارچێوەی پەنجەرەیەکەوە



ڕابمێنمە ڕێگاو شەقامەکان
هاواری من بڵند ترنییە
لەبێدەنگی تۆ
بێدەنگی تۆ
یادەوەری شەوێکە
کەتیایدا هەموو شاعیرەکانی
سەرزەویان لەژورێکدا بەند کردووە
بەرەبەیان
دەرگا کرایەوەو
تەنیا منداڵێکیان دۆزییەوە
لەناو کاغەزێکی زۆردا.
مەرگ

لەبەرامبەر دەرگاکەدا گەڕایەوە
وتی:
من ئەوم چەندینجار
لەبەردەم داری لەسێدارەداند دانیشاندووە
چەندینجار بەقوڵاپی سێدارەدا هەڵمواسیوەو
هیچ جێگەیەکی سنگیشی نادۆزیتەوە
جێ خەنجەری منی پێوە دیار نەبێ
من مەرگم
ئەویش ژیان
هاواری منیش
بڵندتر نابێت لەبێدەنگی ئەو.



ئەودیو شوشەکان
بەسەر شوشە تەمگگرتووەکانەوە دەنووسم
بۆ نمونە میهرەبانی
قژی تۆ
مەرگ
جیاوازی نییە هەر کامیان بێت
هەر وشەیەك
ژنێکە جوانی خۆی لەئاوێنەیەکدا تاقیدەکاتەوە
پیاوێك کەیەك بەیەکی خشتەکان
بەسەر دیواری زیندانەکەیەوە تاقیدەکاتەوە
هەر وشەیەك
تەنیا ڕێبوارێکە کەتێدەپەڕێت
جیاوازی نییە کامیان بێت
ئێمە تەنیا بەسەر شوشە تەمگرتووەکانەوە دەنووسین
تا دارستانی ئەودیو پەنجەرەکە دەرکەوێت.

## بێدەنگی لە فنجاندا

چۆن لەگەڵ تۆدا لەبارەی جانتاوە بدوێم؟!
کە دەرگاکە بکەمەوە
دوو فنجانت لە پەنایەکدا داناوە
بۆنی چاییش
من دەبات
بۆ دەستەکانی تۆ
بۆ کاتژمێر چوار
بۆ ئەو بیرە بچووکەی
کە هەستیت و
دڵتەنگیت لە قۆری گوڵی سوردا لێبنێیت
دەرگا دەکەمەوە
بۆنەکان نەماون
کاغەزێك بەسەر مێزەکەوەیە لەسەری نوسراوە:
((چۆن لەگەڵ تۆدا لەبارەی جانتاوە بدوێم؟))



## درەختی کۆن

دڵسارد مەبە لە چرچ و لۆچەکانی روخسارم
دڵساردی زەردەخەنە نارنجییەکان
پاییزێك کە ئیتر پیربوونی نییە!
درەختێکی کۆنم
هێندە کۆن
کەلە بیرم چووە
رۆژێك
سێوم بووە یان هەرمێ؟
بە ئارەزوو گەلێکی غەمگینەوە
وەك گۆچانێك
قەرەوێڵەیەك
یا پارچەی دار
لەپەنا سۆپایەکدا

### ساتەکانی ئێمە

خۆشم دەوێت
نەك لەبەرئەوەی کەڕابەرم بووە
نەك لەبەرئەوەی کە شا بووە
تەنیا لەبەرئەوەی کە هەمیشە
لەساتەکانی من و تۆدا
لەسەر هەموو نێرگەلەکان دانیشتووە

ناسرەدین شا.



### کافتریا

لە بیست و چوار ساڵیدا نوسراوە

کافتریایەکی تاریك
بیست و چوار دەقیقە بەرامبەر بەیەك
بیست و چوار دەقیقە بێدەنگی
– رەنگە لەکاڵبووەوەکان بێنە بەرچاوی خۆت
خەونە ونبووەکان لە تەمدا
راستی دەکرد

نەبوون
زیاتر بوو لە بوون
هەستام پارەی قاوەکەم داو
هاتمە دەرەوە
لە دنیا.

سکێچی (٣)

راماو بەسەر گۆیەکی بچووکەوە
دووبارە لێکیدایەوە
جێگایەك نەبوو بۆ دارستانی بێ کۆتا
جێگایەك بۆ دەریایەك تا دەڕۆیت
ناگەیتە کۆتاییەکەی
چاوەکانی تۆی خولقاند.



بالّندەی ئاشتی

نەڕێگایەك بە خەون دەگات
نەخەونێك بەڕێگایەك
دەگەڕێمەوە
بۆ رەنگە لەکالّبووەوەکانی دنیا
بۆ قژی دایکم
پێش ئەوەی کە باوکم بیهۆنێتەوە
بۆ خاك
پێش ئەوەی کە تۆ بچیتە ژێرییەوە
ئەو کتێبە بچووکە غەمگینەش
– بوون بەپەیامبەر لەدوورگەیەکی بەتالّدا–

پێکەوە
لەیەکتر هەڵهاتووین
لەخاکەوە
بۆ ژێر خاک
دەڵێی هەموو جادەکانیان
بە قیاس کێشاوە
دەڵێی مەرگیش نوختەیەکە
کەپاش کۆتایی هەموو رستەکان دادەنرێت
ئەو باڵندە بچووکەش
کە خەونی من و تۆ بوو
ئەو باڵندەی ئاشتییە



گەڵایەکیان خستووەتە دەمیەوە
تا بێدەنگ بێت
لە شەوەوە هەڵهاتووم بۆ شەو
دەستەکانت بەرەو تاریکی ببەو
دەستت بەر هەرشتێکیش کەوت
باوەڕی پێبکە.

فلّچە

ناوت لەناو کەوانەیەکدا دەنووسم
کەبۆ هەمیشە دای دەخەم
پاش چەندین ساڵ
وەك دەرگایەکی کۆنە دەیکەنەوە
ژنەکە رامایە دەلاقەکەو پیاوەکە
بەهێمنی دوورکەوتەوە
ئێستا فلّچەکە هەڵگرە!
قژی ژنەکە سپیکە
گرامافۆنەکە بکوژێنەوە.
خەمیش لەناو چوارچێوە رەشەکاندا
بەهەموو دیوارەکاندا هەڵواسە



لەکێشانی تەونەکانی جاڵجاڵۆکەدا ئازادی!
دەرگاکە دادەخرێت و
ناویشت لە کەوانەیەکدا دەنووسم
کەبۆ هەمیشە دای دەخەم
پاش چەندین ساڵ
وەك گۆڕێك هەڵی دەدەنەوە
پیاوێك
قەڵەمەکەی
دەستی
دڵی
لەلای کەوانەیەکی غەمگیندا
گیری کردووە
ئێستا فلّچەکە هەڵگرە!

## تەم

تەم لە ئاسمانەوە دێت
تەم بەسەر زەویدا دەڕوات
هەندێکجار دڵ دەداتە دەریاو
هەندێکجار بە دارستان
لەناو ئەم گومانەشدا
هێدی هێدی
بڵاودەبێتەوە
تەم لە ئاسمانەوە دێت
تەم بەسەر زەویدا دەڕوات



من تەمم
کە هەندێکجار دڵ دەدەمە زەوی
هەندێکجاریش بە ئاسمان
لەنێوان تۆ و خوداشدا
هێدی هێدی
بڵاودەبمەوە

## خەوی ئەم خەنجەرە

خەوی ئەم خەنجەرە
منی شێتکردووە
جیاوازی نییە
کە بەدەستی تۆوە بووە
یابەسنگی ئێمەوە
یا لەناو مشتی ئێمەدا
یابەسەر پشتی تۆوە
خەوی ئەم خەنجەرە
شێتی کردووم
بەفریش دەبارێت
بەسەر دێڕە شعرەکانمدا



بەفریش لەودیو پەنجەرەکەوە دەبارێت
بەفر
بەفر
بەفر
تازە دەزانم
بەفر ماندویەتی خودایە
تا ئەو رادەیەی کە هەست دەکەیت
خەتکوژێنەکەی هەڵگرتووەو
دەیهێنێت بەسەر ناوی من و
هەموو شەقامەکان و
بیرەوەرییەکان و
خەنجەرەکاندا

درۆکانی شاعیرێك

مشکێك کلکی
لەبەر هەتاوەوە دەباتە سێبەر
ژیان سەیر دەڕوات
دەتوانیت هەستیت و
قژت بڕژیتە ئاوێنەوە
دەتوانیت ئەم دێڕانە
وەك ملوانکەیەك
بکەیتە مل و پاشنیوەڕۆ بەپیاسە هەموو
شەقامەکان بگەڕێیت



دەرگاکە
لەدوای خۆت داخە!
پەنجەرەکەم کردۆتەوە
چەندە پێویستم بەهەوایە
هەوا لە سرنجێکی بچووکدا.

تیاماوم چی بکەم؟

دەبمە درەخت

تۆ پاییزی

دەبمە کەشتی

تۆ لەڕادە بەدەر تۆفانیت

تفەنگەکەت هەڵگرەو

بە ئاسوودەیی قسەی خۆت بکە!



ماسییەکانی خاك

ژیان

جانتاکەی کۆکردەوە

مەرگیش تەلیفۆن ناکات.

بوومەتە موسافیرێك لە شەمەندۆفێرێکی دووردا

کە دەبێت لەوێستگەیەکی نادیاردا دابەزێت

هێندە ماندووم

رادەکشێم و

کەم کەم دەچمە ناو خاك

هێندە ماندووم

کەئیدی مەرگیش بەکەڵکم نایەت

من لە درێژە پێدان دەترسم
لەوەی کەتابووت
تەنیا ژورێکی تاریکتر بێت
منیش دووبارە ئێسکەکانت بدۆزمەوە.
پارچە "پازل"ەکانی عەشق
دووبارە ڕێکبخرێنەوە
کەسێك جانتاکەی لەوێستگەدا بەجێ بهێڵێت
ئێمە لەناو سێبەرەکان و ریشەی درەختەکاندا پیاسە بکەین
مارەکانیش
ماسییەکانی گۆمی خاك..
لێوەکانم دەخەمە سەر لێوەکانت
ئەڵێی هیچ رووی نەداوە
تەنیا گڵۆپیان کوژاندۆتەوە.



### درێژەی وێنە

دەستت درێژ دەکەیت
بەڵام
هەرچی سەیردەکەم
درێژەی وێنەکە دیار نییە
چاییەکە لێ دەنێین؟
یا جانتاکە دادەخەی؟
خەوێکی نادیار
ڕێك وەك گەڵایەك بەدەستەکانی باوە
کەنازانین
لەزەویدا هەڵی گرتۆتەوە
یا بەدرەختەوە.

## کتێبەکانی یانەی قەڵەم

| ناوی کتێب | بابەت | نوسەرو وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١ ـ فریوو خۆحەشاردان | چیرۆك | عەتا محەمەد |
| ٢ ـ ئایین (هزر سیاسەت) | سیاسی | یاسین عومەر |
| ٣ ـ بەیەکداکێشانی شارستانێتییەکان | سیاسی | ئاوات ئەحمەد |
| ٤ ـ سوەیلا | ڕۆمان | شارام قەوامی |
| ٥ ـ ڕۆژی هاتنەکەی عودەی | چیرۆك | ئاوات عەبدوڵلا |
| ٦ ـ سیماکانی عەقلانیەت و | سیاسی | ئاوات ئەحمەد |
| ٧ ـ وەنەوشەکەی چوارشەممان | چیرۆك | شیرین.ك |
| ٨ ـ نەبەهەشت لەسەر زەویدایە | سیاسی | ئومێد عوسمان |
| ٩ ـ فیمینیزم | فکری | عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی |
| ١٠ ـ لە ڕوانگەی | فکری | ئومێد عوسمان |
| ١١ ـ منداڵباز | ڕۆمان | فەرهاد پیربال |
| ١٢ ـ کیمیاگەرانی وشە | ئەدەبی | یاسین عومەر |
| ١٣ ـ گوزارشتی مۆسیقا | هونەری | حەمە کەریم عارف |
| ١٤ ـ خەمەکانی ڕۆشنگەری | فکری | ئاوات ئەحمەد |
| ١٥ ـ یەڵماز گۆنەی | هونەری | حەمە کەریم عارف |
| ١٦ ـ هەناسەی پێخەفە | چیرۆك | چنوور سەعیدی |
| ١٧ ـ سادقی هیدایەت | ئەدەبی | حەمە کەریم عارف |
| ١٨ ـ یادەوەرییەکانی کۆلانێکی | چیرۆك | سیامەند هادی |
| ١٩ ـ قالاو یانی قەفەسێکی | شیعر | کەمال ئەمینی |
| ٢٠ ـ تیانووسی پاشای | شیعر | یاسین عومەر |
| ٢١ ـ لەسێبەری پرسیارد | | سەمەد ئەحمەد |
| ٢٢ ـ زەمین وەك پرتەقاڵێك شینە | شیعر | فەرهاد پیربال |
| ٢٣ ـ گێلاسی خوێن | ڕۆمان | عەتا محەمەد |
| ٢٤ ـ حەرامترین | چیرۆك | عەلی پێنجوێنی |

نرخ(١٥٠٠) دینار